# شوێنکەوتەی دایە عایشە بە

ڕەزای خوای لێ بێت

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

سەلامی خوای گەورە لە خوشكانی قەدر گرانم، سەلامی خوای گەورە لە شوێنكەوتوانی دایكە عائیشە الله لێی ڕازی بێت،
سەلامی خوای گەورە لەو خوشكانە بێت كە لەم ڕۆژگارە سەخت و پڕ فیتنەیەدا بەتوندی دەستیان گرتووە بە حیجابەكەیان(نیقابەكەیان)ەوە و فڕێی نادەن بەڵكو لەگەڵ ئەو دژایەتیانەی كە دەكرێتە سەر خوشكان بۆ لابردنی نیقابەكانیان هێشتا ئەوان زۆر توندتر نیقابەكانیان دەبەستن،

سەلامی خوای گەورە لەم خوشكانەم بێت ئەوانەی لەم ڕۆژگارە سەختەدا،

ئاڵای ئیسلامیان شەكاوە كردووە بە نیقابەكانیان وە بوونەتە چقڵ بۆ چاوی دووژمنان

سەلامی خواتان لێبێت ئەی خوشكانی ئەزیز و قەدر گرانم بە پێویستم زانی بە پشتیوانی خوای میهرەبان نامیلكەیەكی بچووک و بەسوود بنوسم سەبارەت بە واجبێتی (نیقاب)، كە كێشەی زۆربەی خوشكانی ئێستا ئەوەیە كە دەڵێن

**" ئایا نیقاب فەڕزە؟ "**

بە پشتوانی الله عزوجل هەموو ئەو بەڵگانە دەخەینە ڕوو كە تێیدا باس لەوە دەكات بەڵێ (نیقاب) فەڕزە

**سەرەتا دەمەوێت ئەوە بخەمە ڕوو بە پشتیوانی الله تعالی**

ئافرەتێک کە نیقابێک دەپۆشێت

نە (دەعبا)یە، نە (ترسناکە)ە

نە (جنۆکە)یە، نە (دزە)

کە هەموو ئەم ناوناتۆرە ناشرینانە دەلکێنن بە ئافرەتێکەوە کە نیقاب دەپۆشێت کە جلو بەرگی حەیا و حیشمەت دەپۆشێت

بەڵکو ئەو جل و بەرگانەی کە دەیپۆشێت جل و بەرگی دایکە عائیشەیە الله لێی ڕازی بێت،

ئایا دەگونجێت بە دایکە عائیشە بوتریت تیرۆرست !!!

دەی ئەو ئافرەتەی کە جل و بەرگی شەرعی دەپۆشێت فەرمانی اللهی جێ بەجێ کردووە و جل و بەرگی دایکە عائیشەی پۆشیوە رضي الله عنها،

کە دەبێت هەموو مەرجەکانی حیجابی شەرعی تێدابێت....

**بۆیه خوشکی ئەزیزم**

تێفکره و چیتر با شیطان فریوت نەدات دوای ئەوەی ئەم بەڵگانەت بینی

مەهێڵە فریوی دەستی شیطان بیت و بڵێی نەخێر ئەم جل و بەرگانە بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێت!!

بەڵکو لەهەموو کاتێک زیاتر

ئافرەت ئێستا زۆر پێویستی بە پۆشینی ئەم جل و بەرگانە هەیە،

چونکە سەرەتا سەردەم سەردەمی فیتنەیە، وە پاشان ئافرەت بۆخۆی سەرچاوەی فیتنەکەیە.....

**هەر بۆیە لەگەڵم بە....**

الله تعالی لە قورئانە پیرۆزەکەیدا دەفەرمووێت (یَا أَیُّهَا النَّبِیُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِینَ یُدْنِینَ عَلَیْهِنَّ مِن جَلَابِیبِهِنَّ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن یُعْرَفْنَ فَلَا یُؤْذَیْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِیمًا) الأحزاب ٥٩

ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) بە هاوسەرانت و کچەکانت و ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: کە بە پۆشاکی باڵا پۆش خۆیان داپۆشن ئەوە لەبارترین شتە کە پێی بناسرێن، تا ئازار نەدرێن و (توشی گیروگرفت نەبن)، هەمیشەو بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە (لە کەم و کووڕی ڕابوردووتان خۆش دەبێت)

**ابن عباس لەبارەی ئەم ئایەتە دەفەرموویێت**

خودای گەورە لەبارەی ئەم ئایەتە فەرمانی بە ئافرەت کردووە لە کاتی چوونە دەرەوەیان پێویستە دەموچاویان داپۆشن لە تۆقی سەریانەوە بە جلبابەوە هیچ شوێنێکیان دیار نەبێت تەنها یەک چاو نەبێت ئەویش بۆ بینینی ڕێگا نەبێت

**فتاوی_علماء_للنساء_ص٣٩**

پاشان الله تبارك وتعالی لە سوورەتی النور دەفەرموویێت

{وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ} النور ٣١

با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانداو جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن

**عن صفية بنت شيبة أن عائشة رضي الله عنها كانت تقول : لما نزلت هذه الآية ( وليضربن بخمرهن على جيوبهن ) أخذن أُزُرَهن (نوع من الثياب) فشققنها من قبل الحواشي فاختمرن بها**

واتە:لە صفیەی کچی شیبەوە هاتووە کە عائیشە دایکی ئیمانداران (رضي الله عنها) فەرموویەتی:ئەوکاتەی کە ئەم ئایەتە دابەزی

" وليَضرِبنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلى جُيُوبِهِنَّ"

لە دامێنی کراسەکانمان پارچەمان لێدەکردەوە و ڕوخسارمان پێ دادەپۆشی

**البخاري، كتاب التفسير، رقم:٤٧٥٩**

**محمدی كوری سيرين دەفەرموويّت:**

پرسيارم كرد لە عبيدە السلماني دەربارەی ئەم ئايەتەی خوای گەورە.

{يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ}

ئەويش فەرمووی مەبەستی پێی داپۆشينی دەم و چاوە.. واتە (نيقاب)

**بڕوانە كتێبی (تفسير إبن كثير ٢٨٣/٣)**

دوای دابەزينی هەموو ئايەتەكانی حجاب الله تعالی ئەمری كرد بە داپۆشينی هەموو لاشە و ڕووخساريش-نيقاب-

**هەروەک پێشەوا ابن عباس فەرموويەتی ڕەزای الله تعالی لێبێت...**

لە (علي بن أبي طلحة)ەوە هاتووە

كە پێشەوا (إبن عباس) رەحمەتی الله تعالی لێبێت فەرموويەتی:

{الله تعالی فەرمانی كردووە بە ئافرەتی ئيمانداران كاتێک دەردەچن لەماڵ بۆ پێويستيەک دەبێت ڕووخساريان داپۆشن بە جلبابەكانيان-نيقاب- تەنها يەک چاويان دەربخەن}

(وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُولِي الْإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَىٰ عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) النور ٣١

به ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (له تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن له گوناهو جوانی خۆیان دەرنەخەن جگه لەوەی که دیاره ، با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانداو جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن به تەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکی خۆیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕی خۆیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێك که پەیوەندیان هەیە پێکەوە، یان ئەوانەش که کەنیزەکانیان (که له بارودۆخی تایبەتدا هەبوون) یان ئەوانەی که له ماڵەکانتاندا دەژین و پێویستیان به ئافرەت نی یه (له بەر پیری، یان نەخۆشی... هتد) یاخود ئەو منداڵانەی که هێشتا شارەزاییان له ئافرەتان نیەو (ئارەزووی جنسیان بۆ دروست نەبووەو نازانن باسی عەورات بکەن) نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن به زەویدا (تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت که زینەتدارو خشڵدارن، کەواته هەمووتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوه بۆ ئەوەی ڕزگارو سەرفرازبن.

سەرنج: روون و ئاشکرایە کە جوانی ئافرەت دەم و چاویەتی، بزانە وردبەرەوە کە کوڕێک دەچێتە داوای کچێک یەکەم جار بەر لەهەموو شتێک سەیری دەمو چاوی دەکات، ئەمەش دەلالەتە لەسەر ئەوەی کە دەم و چاوی ئافرەت جێگای سەرنج ڕاکێشیە بۆ پیاوان وە بەدەرخستنی دەبێتە هۆی فیتنە و شەهەوات

**لە سوونناەتدا هاتووە:**

ئیمامی بخاری و مسلم لە (کتاب التفسير) لە باب (صدر الباب السنن) بە ڕیوایەتی دایکمان عائیشە رضی الله عنها، ئایەتی حجاب لەساڵی (٥)ی هجری هاتە خوارەوە وە تەفسیری عبداللهی کوڕی عومەر کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی:(لا تتنقب المراة المحرمة، ولا تلبس القفازين)

**صحيح مسلم رقم ١٥/٣/١٨٣٦**

واتە: نابێت ئافرەت لەکاتی ئیحرام دەمو چاوی داپۆشێ و دەستەوانە لەدەست بکات

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئافرەتانی زەمانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێچە و دەستەوانەیان لەبەرکردووە و خۆیان ستر کردووە لەبەرامبەر پیاواندا

لە (صفیەی کچی شیبە)و هاتووە کە عائیشە دایکی ئیماندار ان رضی الله عنها فەرموویەتی: ئەوکاتەی ئەم ئایەتە دابەزی (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) لەدامێنی کراسەکانمان پارچەمان لێدەکردەوە و ڕوخسارمان پێ دادەپۆشی

**رواه البخاری (٤٤٨١) و أبو داود (٤١٠٢)**

لە (عروه) وە هاتوە کە عائیشە رضی الله عنها فەرموویەتی: (ڕەحمەتی خوا لە ژنە کۆچبەرەکانی سەرەتا بێت کاتێک ئەو ئایەتە دابەزی پارچەیان لە کراسەکانیان کردەوە و کردیانە نیقاب، واتە دەموچاویان پێ داپۆشی)

لە عائیشەوە رضی الله عنها فەرموویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لەکاتی ئەنجامدانی نوێژی بەیانی ئافرەتان دەچوون بۆ نوێژ کاتێ تەواو دەبوون وا خۆیان دادەپۆشی لەکاتی گەڕانەوەیاندا کەس نەیان دەناسی

**رواه البخاری**

**ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئافرەتانی پێشین بەشێوەیەک وا خۆیان دادەپۆشی کە دەم و چاویشیان بەدەرەوە نەبووە و کەس نەیتوانیوە بیان ناسێتەوە**

لە ئەسماوە (رضي الله عنها):

**(ئێمە روخساری خۆمان لە پیاوانی بێگانە دادەپۆشی، واتە لەسەردەمی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم)**

کەسانێک ئەم فەرموودەیە دەکەن بە بەڵگەی ئەوەی کە نیقاب واجب نییە:

**#بەڵام!! ئاگاداربن ئەوە حدیثێکی زۆر لاوازە.**

هەم لە ڕووی مەتنەوە هەم لە ڕووی سەنەدەوە، پێشەوا ابن ابي حاتم و أبو داود و ابن عدي و چەندەها زانای تر قسەیان لەسەر کردووە.

قال أبو داود: هذا مرسل خالد بن دريك لم يدرك عائشة رضي الله عنها، وقال ابن القطان: ومع هذا فخالد مجهول الحال، وقال منذري: في إسنادة سعيد بن بشير أبو عبد الرحمن النصري نزيل دمشق مولى بني نصر وقد تكلم فيه غير واحد.

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا : أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ دَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَيْهَا ثِيَابٌ رِقَاقٌ ، فَأَعْرَضَ عَنْهَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، وَقَالَ : " يَا أَسْمَاءُ إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلَّا هَذَا وَهَذَا ، وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ

واتە: عایشە دەڵێ: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (رضي الله عنه)، هاتە لای پێغەمبەری خودا ﷺ، پۆشاکێکی تەنکی لەبەردا بوو، پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووی لێ وەرگێڕا و فەرمووی «ئەی ئەسماء! ئافرەت دوای ئەوەی باڵغ دەبێ، ناگونجێ هیچ شوێنێکی لاشەی ببینرێ جگە لەوە» ئاماژەی کرد بۆ ڕووخسار و هەردوو لەپی دەستی.

**مەبەستی لاوازی فەرموودەکەیە**

رەحمەتی خوای پەروەردگار بڕژێت بەسەرتاندا خوشکانم

ئەوەی بینیتان هەموو بەڵگەبوون لە قورئان و سووننەت کە باس لە (واجبێتی نیقاب) کراوە

خوشکەکەم، نیقابەکەت بپۆشە بیر بکەوە دەبێ پاداشتت لای خوای میهرەبان چەندە زۆر بێت کاتێک تۆ بەو تەمەنە گەنجێتیەوە پشتت کردووە لە شەهەوات و ئارەزوو و خۆشیەکانی گەنجێتی و دوونیا هەموویت وەلا ناوە لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی الله....

**دەبێ ئەم گەنجە بەم تەمەنە گەنجەیەوە چ پاداشتێکی هەبێت لای الله جل جلاله...!!!**

هەر بۆیە لەم سەردەمە پڕ فیتنەیەدا

کە هەموو لایەک پڕە لەو ئافرەتانەی کە جل و بەرگیان لەبەردایە بەڵام ڕووتن...

هەموو لایەک پڕە لەو ئافرەتانەی کە شوێن هەواو و نەفسیان کەوتون بەشوێن مۆدێلات و کڕینی ماکیاژ و جل و بەرگی مۆدێرنن پشتیان لە دینەکەی الله کردووە...

تۆ جیاواز لەوان بە حیجابەکەت بە نیقابەکەت ببە بە سومبولێک بۆ ئەم ئیسلام و ئەم دینە ببە بە پێشڕەو بۆ ئافرەتانی پاش خۆت لە حەیا و حیشمەت و شەرم و حەیا و داپۆشراویی..

قسەکانیان وەلانێ کە دەڵێن نەسووتای لەنێو ئەو حیجابە گەرمەدا!!

پێیان بڵێ :

**عاباو نیقاب زۆر گەرمە ئیمانێکی بەرزی دەوێ ..**

[قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ] التوبه ٨١

ئەی پێغەمبەر - ﷺ - پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە لەم گەرمای هاوینە ئەگەر ئێوە تێئەگەن.

کە ئارام نەگرن لەسەر ئەم گەرماییەی دونیا چۆن ئارام ئەگرن لەسەر ئاگری دۆزەخ، پێغەمبەری الله - صلى الله عليه وسلم - دەفەرموێت: {ئاگری دونیا بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ}

**سوپاس بۆ پەروەردگار کە توانیمان باسێکی کورت بکەین لە (واجبێتی نیقاب) بە پشتیوانی الله تعالی**

لێرەدا خوشکانی ئەزیزم، دەمەوێت بإذن الله تعالی باس لە دیاردەیەک بکەم کە ئێستا لەنێو خوشکاندا زۆر بەربڵاوە وە بۆتە چاولێکەری کە هەمووان چاو لەوی تردەکەن و بەباشی دەزانن..!!

ئەویش بریتیە لەوەی لەم سەردەمەی ئێستادا نیقاب لەجێی ئەوەی جوانیت داپۆشێت و سەرنجی خەڵک ڕانەکێشیت بە نیقابەکەت و نەبیتە فیتنە بۆ سەر نامەحرەم،

بەڵام بەداخەوە بە پێچەوانەوە خودی نیقاب لەم سەردەمەدا بۆتە فیتنە وە بۆتە مایەی سەرنج ڕاکێشانی کەسی چواردەور بە بەکارهێنانی شێوازی نوێ و تێکەڵکردنی مۆدێلات بۆ نیقاب...

**لێرەدا بەپشتوانی خوای پەروەردگار**

**ئەو خاڵانە دەخەینە ڕوو کە لەنێو ئافرەتانی (نیقاب) پۆشدا بڵاوبۆتەوە...**

خوشکی ئەزیزم،کاتێک خوای گەورە فەزڵی خۆی بەسەردا ڕژاندی و شەڕەف مەندی کردی بە پۆشینی ئەو عابا و نیقابە، ئەو شکۆ و ڕێزە گەورەیەی پێت بەخشی،

ترسی الله لەدڵت داهەبێت...

بەو جۆرە نیقابەکەت بپۆشە کە دایک عائیشە و ئافرەتانی سەلەف پۆشیویانە خۆت بەدوور بگرە لە فیتنە نەک ببیتە مایەی فیتنە

▪دەبینم لەنێو نیقاب پۆشەکاندا مۆدێلی تازە درووست دەکەن، وە نێوچەوان و برۆیان بەدەر دەخەن ئەمە کوێی شەرعییە خوشکی من! ئەمە چ جۆرە نیقابێکە !؟

لێت ئەپرسم ئەمە ناوی نیقابە!

بەم نیقابەوە کە ناوچەوان وبرکۆت دیارە بەخۆت دەڵێی شوێنکەوتەی دایکە عائیشەم و لەسەر رێبازی ئەوم!!

ئەمە وەک و دەمامکێکە و دەرخستنی زینەت و جوانیە خوشکم!!!

**باشه بۆچی ئەو ئافرەتانەی کە نێو چاوان و برۆکانیان داپۆشیوە و خەڵکی لێیان دەترسن و ئافرەتێکیش کە نێوچاوان و برۆی دەرخستوە دەست خۆشی لێدەکەن فەرقی ئەم دوو نیقابە چییە؟**

بەهەردووکیان دەوترێت نیقاب

بەڵام لە یەکێکیان دەترسن، ئەوی تریش دەست خۆشی لێکەن**!!**

چونکە ئەوەی یەکەمیان بەبێ هیچ مۆدێلاتێک وەک ئافرەتانی پێشین نیقابی پۆشیوە بۆیە بە تیرۆرست و شەبەح ناوی دەبەن،

بەڵام ئەم نیقابەی ئێستا کە بە مۆدێلاتە و ناوچەوان و برۆت دیارە لەگەڵ سەردەمدا دەگونجێت و بەدڵی خۆتە چۆنت بوێت ئاوها مۆدێلاتی تێدا بەکاردێنیت**!**

**خوشکە باشەکەم، ئەی شوێنکەوتەی دایە عایشە، نێوچاوان و برۆ دەبێت داپۆشرێ وە واچاکترە چاوەکانیشت داپۆشی...**

خوشکی موسوڵمانم خۆت بۆ الله تعالى یەکلایی بکەرەوە و بە نیەتێکی پاک نیقابەکەت بپۆشە و با مەبەستت تەنها بەدەستهێنانی ڕەزامەندی الله تعالى و جێبەجێکردنی فەرمانەکانی زاتی بەرزی بێت,, ڕەحمەتی خواتان لێ بێت خوشکانی موسوڵمانم خۆت دووربخەوە لەم مۆدێلات و بەناو حیجاب و عەبایانەی هیچ مەرجێکی شەرعی تیا نیە.

**▪زۆر گرینگە بۆ خوشکانی نیقاب پۆشم لەدەست کردنی (دەستکێش)**

تکایە خوشکانم دەستی پێوە بگرن

زۆر خوشک دەبینم دەست کێش لەدەست ناکات وە بەشتێکی ئاسایی دادەنێت لەکاتێدا پێستی دیارە و نامەحرەم نەزەری لێدەکات با هیچ کەسێک نەزانێت ڕەنگی پێست و قەبارەی جەستەت چۆنە!

بۆیە دەست کێش لەدەست بکە کاتێک دەچیتە دەرەوە ڕەحمەتی الله بڕژێ بەسەرتدا...

**▪نینۆک درێژکردن خەریکە دەبێتە عادەت لەنێو باڵاپۆشاندا،**

الإمام أحمد دەڵێت :

نینۆکی ئافرەت عەورەتە، کاتێك چوە دەرەوە دەریان ناخات نە دەستی و نە نینۆکیشی.

**#أحكام_النساء_للإمام_أحمد_٣٢**

**خوشکی من کاتێک نیقاب دەپۆشی ناکرێت نینۆکەکانت بەدرێژی بهێڵیتەوە**

چونکە سیمای حیجابەکە تێک دەدەی بەو کارەی ئەنجامی دەدەی وە دەبیتە نمونەیەکی ناشرین بۆ کەسانێک کەدەیانەوێ ببن بە باڵاپۆش چاو لەتۆ دەکەن خوشکەکەم، دەڵێن مادام نیقاب پۆشەکە نینۆکی درێژ کرد منیش درێژی دەکەم دیارە جائیزە بۆیە درێژی دەکات....

بۆیە وریابە بزانە هەموو مەرجەکان نیقابی شەرعیت تێدایە..!!

**▪برۆ کردن حەرامە وە لەعنەتی خوای لەسەرە:-**

بۆیە رەحمەتتان لێبێت، لێی دووركەونەوە، نەڵێن ئێمە مادام نیقاب دەپۆشین برۆمان بەدەرناکەوێت و بۆ هاوسەری خۆمان برۆمان هەڵدەگرین!!

نەخێر بەڵكو برۆ کردن یەکێکە لەو تاوانە گەورانەی بۆ مەحرەمی خۆشت نابێ دەسی بۆ ببرێت و توشی هەمان تاوان ئەبیت،، وە بزانە خوای گەورە هەر شتێکی لەم دینە قەدەغە کردبێت ئەوا بە دڵنیایی باشترین شتی بۆ هەڵبژاردووین و خۆی ئەزانێ چی بۆ بەندەکانی خێردارتر و چاکترە،

وریابن دەست لەبرۆکانتان مەدەن چونکە

برۆ کردن : بە هەموو شێوەیەك حرامە و یەکێکە لە تاوانە گەورەکان (**الکبائر**)،

**ئەمەش بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە (ابن مسعود) دەیگێڕێتەوە و فەرموویەتی:**

((لعن الله الواشمات والمستوشمات والنامصات والمتنمصات والمتفلجات للحسن المغيرات خلق الله)) صحيح مسلم رقم: (2125).

واتە: خوا لەعنەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کەوا خاڵادەکوتن و ئەوانەش کە داوادەکەن خاڵیان بۆ بکوترێت، وە لەو ئافرەتانەش کەوا برۆ دەکەن و ئەوانەش کە داوادەکەن برۆیان بۆ بکرێت، وە لەو ئافرەتانەش کەوا بەینی ددانەکانیان دەکەنەوە بۆ جوانکاری و گۆڕان بەسەر دروستکراوی خوادا دێنن.

- **سەبارەت بەو خوشکانەی کە چاویان دیارە واتە (کەپ) بەکار ناهێنن، موکیاج دەکەن و چاویان دەڕازێننەوە...**

لە اللە بترسە خوشکم کاتێک ماسکارا و رمێل بەکاردێنی بۆ چاوت و دەڵێی تەنها چاوم دیارە سوێن بە اللە زۆر سەرنج ڕاکێشتری لە ئافرەتێکی سفور

وە بەو شێوەیە سەرنجی پیاوان زۆر زیاتر بۆخۆت ڕادەکێشی وە لەجێی پاداشت تاوان لەسەرت دەنوسرێت بەڕازاندنەوەی چاوەکانت..

- **خوشکانم پێویست ناکات پێڵاوی پاژنە بەرز لەبەر کەیت**

بەهۆیەوە دەنگی بێت کاتێک بە ڕێگادا دەڕۆی، ئافرەتی وادەبینم عەبا دەپۆشی یان نیقاب بەڵام پێڵاوێکی پاژنە بەرز لەپێ دەکات و بەدەنگی پێڵاوەکەی سەرنجی هەموان بۆخۆی ڕادەکێشێ...

- **وە کۆمەڵە خوشکێکی تر نیقاب لەسەردەکەن بەڵام جل و بەرگیان لە ژێرەوە بەهیچ شێوەیەک شەرعی نییە:**

دەموچاو و دەستیان شاردۆتەوە (هەندێکیشان تەنها دەموچاویان)، بەڵام جل و بەرگیان یان تەنورە لەبەردەکەن یان عەزێ

کە قالبی جەستەیان بەدەرکەوتووە تێیدا

لەکاتێکدا دەبێت عەبایەکی شەرعی لەگەڵدا لەبەربکەن کە قیاسی لەشیان بشارنەوە نەک دەری بخەن!!!

بۆیە تکایە خوشکانی ئەزیزم خۆتان بەدوور بگرن لەلەبەرکرنی ئەو جۆرە جلانە لەگەڵ نیقابدا، ئێوە نمونەی ئافرەتی چاک و صاڵیحە بن و ببن بە باشترین نمونە

جل و بەرگ تێک مەدەن و بەئارەزووی خۆتان مۆدێلاتی بۆ زیاد مەکەن بەو شێوەیەی کە هاتووە بیپۆشن لەهەر کات و سەردەمێکدا بن نەک بەو شێوەیەی کە خۆت دەتەوێ بیپۆشیت...

**▪هەوڵدە زیاتر ئەو ڕەنگانە لەبەربکەی کە مات شاراوەن و جێی سەرنج نین..**

بەتاییەت (ڕەنگی ڕەش)

ڕەنگێک مەپۆشە بەلەبەرکردنی پۆشاکەکەت سەرنجی پیاوان ڕاکێشی بەو ڕەنگە

**پاشان خوشکانم**

**دیاردەیەکی زۆر خراپ لە ناو نیقاب پۆشەکان بڵاو بۆتەوە ئەویش وێنە گرتنە لەویش خراپتر بڵاو کردنەوەی وێنەکانی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان**

بەڕاستی ئەمە نەک تەنها تاوانە بەڵکو گەورەترین فیتنەیە

ئەم دیاردەیە زۆر بەربڵاوە و هەموو تۆرەکومەڵایەتیەکانی داگیر کردووە

کە نیقاب پۆشەکان بونەتە مایەی فیتنە

بە بڵاوکردنەوەی وێنەی خۆیان لە تۆڕەکۆمەڵایەتەکان

**وە خوشکی خۆم وریایی قسەکردن و دەنگتان بن ئاگادار بن**
نابێت ئافرەتان بە شێوەیەکی نەرم و دەنگێکی ناسک قسە بکات لەگەڵ پیاوانی نامەحرەمدا ، تۆ وەک و ئافرەتێکی مەردبە ئەی خوشکی سەنگینم بە شێوەیەک قسە مەکە کە دڵ نەخۆشەکان تەماح بکەن و دڵی نەخۆشیان لاواز بکەی نەخێر!!

بەڵکو تۆ ببە بەو ئافرەتەی هیچ کەسێک نەتوانێ بۆ ئارەزووی خۆی بەکارت بێنێ ، بەڵکو تۆ سەربەرزبە و لە سەرفرازان بە ئەی خوشکەکەم ، ڕەزامەندی خوا بەدەست بێنە و فەرمانەکانی جێبەجێ بکە

کە الله تعالی لە قورئان فەرموویەتی: [ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَعْرُوفًا] [الأحزاب: ٣٢].

واتە: بە شێوازێك دەنگتان ناسك مەكەنەوە، كە پیاوە دڵ نەخۆشەكان تەماحتان لێبكەن بەڵكو فەرمووی: بە شێوازێکی ناسك قسە مەکەن لە گەڵیاندا

**دادە خۆشەویستەکانم زۆر زۆر وریایی ڕەفتارێکی دیکە بن کە پەنا بەخوای گەورە سزایەکی قورسی لەسەرە ، ئەویش بەرزکردنەوەی قژتانە لەژێر حجاب و نیقابدا !:**

أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : «صِنْفَان من أهل النار لم أَرَهُما: قوم معهم سِيَاط كَأذْنَابِ البَقر يضربون بها الناس، ونساء كاسِيَات عاريات مُمِيَلات مَائِلات، رُؤُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ البُخْتِ المائِلة لا يَدْخُلْن الجَنَّة، ولا يَجِدْن ريحها، وإن ريحها لَيُوجَد من مَسِيرة كذا وكذا». [صحيح] - [رواه مسلم]

لە ئەبی هورەیرەوە -ڕەزای خوای لێبێت- کە پێغەمبەری خودا -صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: **«دوو کۆمەڵ لە ئەهلی دۆزەخ نەیانم بینووە:** کۆمەڵێک قامچیان پێیە وەکو کلکی مانگا وایە پێی لە خەڵکی دەدەن، وئافرەتانێک پۆشتەن بەڵام ڕووتن وبەلەنجە ولار ڕێدەکەن، وگوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودا ناکەن، وخەڵکی بۆ سەرپێچیکردنی فەرمانەکانی خودا بانگدەکەن، وقژیان وەکو کۆپارەی سەر پشتی وشتر (کۆپارەی وشتر) لار بووەتەوە؛ ناچنە بەهەشتەوە، وبۆنی بەهەشت ناکەن، وئەگەرچیش بۆنی بەهەشت لە دووریەکی زۆرەوە دەکرێت».

**صەحیحە - موسلیم گێراویەتیەوە**

واتای فەرموودەکە: (دوو کۆمەڵ لە ئەهلی دۆزەخ نەیانم بینووە): واتا لە سەردەمی ئەودا نەیانی بینیووە ئەمیش بەهۆی پاکی ئەو نەوەیەی لەو سەردەمەدا بووە، بەڵکو لە پاش ئەو سەردەمانە ڕوویدا وئەمیش لە موعجیزەکانی پێغەمبەرە -صلی الله علیه وسلم- کە خوای گەورە ڕووداوەکانی داهاتووی پێنیشانداوە.

صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێت: (وقژیان وەکو کۆپارەی سەر پشتی وشتر (کۆپارەی وشتر) لار بووەتەوە): جۆرێک لە وشتر هەیە کۆپارەکەی سەر پشتی زۆر بۆ لای ڕاست یان چەپ لار بووەتەوە وقژیان بەم شێوەیە کۆ دەکەنەوە وبەرزی دەکەنەوە وەکو کۆپارەی وشتر،

## وهەندێک لە زانایان دەڵێن:

**ئەم جۆرە ئافرەتانە شتێک دەکەنە سەریان وەکو مێزەری پیاوان وایە هەتا قژیان لە ژێر لەچکەکانیان بەرز دەبێتەوە** و وەکو کۆپارەی لار بووەوەی وشتری لێدێت. (ناچنە بەهەشتەوە، وبۆنی بەهەشت ناکەن، وئەگەرچیش بۆنی بەهەشت لە دووریەکی زۆرەوە دەکرێت.)

خۆڕازاندنەوەی ئافرەت بۆ دەرەوەی ماڵی خۆی هۆکارێکە بۆ ئەوەی پیاوان تووشی خراپە وفیتنە بن وئەمیش هۆکارە بۆ ئەوەی نەچێتە بەهەشتەوە، پەنا بە خودا، واتا نزیکی بەهەشت نابنەوە وئەم جۆرە ئافرەتانە بۆنی بەهەشت ناکەن ئەگەرچیش بۆنی بەهەشت لە دووری حەفتا ساڵەوە دەکرێت، چونکە لە ڕێگای ڕاست لایدا وگوێڕایەڵی شەیتانی کرد بەهۆی ئەوەی باڵاپۆش نەبوو بە جلی شەرعی وتەقوادار نەبوو ولە سزای خودا نەترسا، وخۆی تووشی خراپەکاری کرد وخەڵکیشی بۆ فیتنە وخراپەکاری بانگکرد.

**▪ڕەحمەتتان لێبێت خوشکانم بۆن بەکارمەهێنن کاتێک دەچنە دەرەوە لەماڵ**

حوکمی ئەو ئافرەتانە چییە کە کاتێک لە ماڵ دەر دەچن بۆن لە خۆیان ئەدەن ؟

دروست نیە بۆ ئافرەتان کاتێک لە ماڵ دەر دەچن بۆن لە خۆیان بدەن و خۆیان بڕازێننەوە، جا ئەو دەرچوونە بۆ نوێژ کردنی بێت لە مزگەوت یان بۆ سەردانی کردنی خزم و کەس و کاری بێت یان بازار بێت، وە بە هەمان شێوەش ئەو بۆنە لەماڵەوە پێش دەرچوونەکەی لە خۆی بدات یان لە ڕێگا یان لە مزگەوت لە خۆی بدات، هەروەها ئەوەش دروست نیە کە کاتێک لە ماڵەوە بۆن لە خۆی ئەدات و دەچێتە لای کەسانێک کە نا مەحرەمن بۆی، یاخوود کەسانێکی نامەحرەم بێن بۆ ماڵیان، با لە ماڵی خۆیشی دەر نەچێت، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی دروست بوونی فیتنە و هۆکارە بۆ خراپەکاری و سەرپێچی کردنی شەرعیشە، کە زۆر گرنگە بنبڕ بکرێت، چونکە هەمووی فێڵ و تەڵەکەی شەیتانە کە لە نێو گیانی مرۆڤدا جوولە دەکات هەر وەکو چۆن خوێن بە لاشەی مرۆڤدا جوولە دەکات.

بەڕاستی لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا – ﷺ – فەرموویەتی : «**أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ فَمَرَّتْ عَلَى قَوْمٍ لِيَجِدُوا رِيحَهَا فَهِيَ زَانِيَةٌ، وَكُلُّ عَيْنٍ زَانِيَةٌ**».«صحيح الجامع» (٢٧٠١).

واتا: هەر ئافرەتێک خۆی بۆن خۆش بکات و بەلای کەسانێکدا تێ بپەڕێت تاوەکو بۆنی بکەن، ئەوا وەکو ئەوە وایە کە زینای کردبێت، وە هەموو چاوێکیش زیناکارە

{ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ}

واته: نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و پێیان بدەن بە زەویدا (تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت کە زینەتدارو خشڵدارن،

مەبەستی لە ئەو ئافرەتانەی کە عەبا و نیقابیشن پێتان بەزەویدا مەدەن بە توندی کە دەنگی خڕخاڵتان بێت و بزانرێت خڕخاڵتان لە پێیە ، یان دەستان ڕابووشێن و بزانرێت بازنگتان لە دەستایە، یان پێڵاوێکی بن ڕەقت لە پێ کردوە و کە پێ ئەدەی بە زەویدا ئاوا دەنگی دێت، هەرچەندە داپۆشراویش بیت بەڵام کە وات کرد بۆ ئەوەی دەنگی بێت ، ئەوا خوای گەورە قەدەغەی کردوە و نەهی کردوە لێت بۆ ئەوەی زینە و جوانیەی لە ژێرەوە دەرکەوێ ، ڕاستە حەڵاڵە لەبەرت کردوە مادام پیاوی نامەحرەم نایبینێ و لە ژێر عەبا و جلی شەرعی شاردووتەوە، بەڵام نابێ دەست و قاچت ئاوا بجوڵێینی و دەنگی بێت و پیاوێکی نامەحرەم گوێی لێ بێت ، بە هیچ شێوەیەک دروست نیە و تاوانە

**دەرخستنی میکیاج و جوانی و دەست و دەموچاو بۆ پیاوانی نامەحرەم ، سەرپێچیەکی ڕوون و ئاشکرایە** لەبەر وتەی الله تعالی کە فەرموویەتی : ﴿وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾. واتە : جوانی خۆیان دەرنەخەن ، جگە لەوەی کە دیارە.

﴿ إِلا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾ مەبەست لەوەیە کە : ئەوەی کە دیارە لەناو نوێژدا لە دەموچاو و دوو دەستەکان ، مەبەستی ئەوە ناگەیەنێت کە نیقاب واجب نەبێت ، بەڵکو ئەمە باسی عەورەتە لەناو نوێژ ، کەواتە ﴿ إِلا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾ بۆ سنووری عەورەتی ئافرەتانە لەناو نوێژ ، خۆ گەر پیاوێکی نامەحرەمی لێبوو ئەوە پێویستە دەموچاو و دوو دەستەکانیشی داپۆشێت ، هەروەها تەفسیر کراوە بە پۆشاکی شەرعی و جیلباب ، واتە : جوانی خۆتان دەرمەخەن جگە لەوەی دیارە لە پۆشاك و جیلباب ، چوونکە ئەو دوو شتە خۆیان داپۆشەرن ، داناپۆشرێن..

←وأخْرَجَ ابْنُ أبِي شَيْبَةَ، وابْنُ جَرِيرٍ، وابْنُ المُنْذِرِ، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ قالَ : الزِّينَةُ زِينَتانِ : زِينَةٌ ظاهِرَةٌ، وزِينَةٌ باطِنَةٌ لا يَراها إلّا الزَّوْجُ. فَأمّا الزِّينَةُ الظّاهِرَةُ : فالثِّيابُ. ( تفسير الدر المنثور )

**←ابن مسعود رضي الله عنه فەرموویەتی : جوانی دوو جۆرە :**

١) جوانی ئاشکرا.

٢) جوانی شاراوە.

- **جوانی شاراوە :** ئەوەیە کەس نایبینێت و بۆ کەسی تر دەری ناخات تەنها بۆ مێردەکەی نەبێت.

- **بەڵام جوانی ئاشکرا :** بریتیە لە پۆشاکەکەی.

**←بۆیە خوشکان ڕەحمەتی الله ـتان لێبێت ، جوانیتان دەرمەخەن و خۆتان بپارێزن الا بۆ پیاوەکانتان نەبێت ، بۆ ئەوەی نەبنە هۆکارێك بۆ بڵاوبوونەوەی فیتنە و فەسادی ، چونکە ئەنجامی ناشەرعی هەر تیاچوون و هەلاکەتە..**

لەکۆتایی قسەکانمدا پێتان دەڵێم خوشکانی موسوڵمانم

دادە باشەکانی من زۆر پێداگری بکە لەسەر خۆ داپۆشین و بوون بە نمونەی باڵاپۆشی و شەرم و حەیا ،ئەی خوشکەکەم لەوانە مەبە کە لە گۆرانی و لە دەمی کەسانی سەرخۆش و بێ ئاگا لە ژیان و خێزانی خۆشیان باسبکرێیت ، با تۆ لەوانەبی کە ببی بە نمونەی خوشکانی موسوڵمان و شایەنی ئەو وەسفە بیت کە خوای گەورە لە قورئاندا وەسفی کچەکەی ئەو پیاوە پیرە چاکە ئەکا کە موسا علیە سلام یارمەتیانی دا لە کار و باری شوانیدا، بە پێچەوانەی ئەو خوشکانەی فیتنە ڕۆژگار دڵی ڕەق کردوون و ملیانناوە بە دونیایەکی کاتی و تێپەڕیو،بەڕاستی خۆشیەکانی دونیا زۆر کەمە و کۆتاییان دێت

خوای گەورە لە وەسفی کچەکەی ئەو پیاوە پیرە ئەفەرموێت:
[ فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ ]

واتە: یەکێك لە کچەکان هات بۆ لای موسا زۆر بەشەرم و حەیاوە دەرۆیشت بە ڕێگەدا

**[سوڕەتی القصص:25]**

وەک ڕیوایەت کراوە لە گەورەی موسوڵمانان عومەری کوڕی خەتاب(ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێ: **بە لایەکی کراسەکەی خۆی داپۆشیبوو.**

**الطبري (١٩/٥٥٧)**

ئیبنو ئەبی حاتەم ڕیوایەتی کردوە ئەمیش لە عەمری (عمرو) کوڕی مەیمونەوە گوتی: عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) وتی: [ **تَمْشِي عَلَى ٱسْتِحْيَآءٍ** ] **واتە: پۆشاکەکەی دابوو بە ڕووی خۆیدا لەو ژنانە نەبوو کە گرنگی نەدات بە خۆداپۆشین و هەمیشە دەرو ماڵ بکات.**

**الطبري (١٩/٥٥٨)**

*** وە شتێکی دیکە کە لەم چیرۆکە بەڕاستی زۆر جێگای سەرنج و تێڕامانە ئەوەیە:**

کاتێک یەکێک لە دوو کچەکەی بە باوکی وت ئەی باوکە گیان بە کرێی بگرە بۆ شوانی ، چونکە بەڕاستی چاکترین کەسە کە بە کرێی بگری ( إِنَّ خَيْرَ مَنِ ٱسْتَـْٔجَرْتَ ٱلْقَوِىُّ ٱلْأَمِينُ) واتە ;- بەهێز و ئەمینەئەمە (دەست و داوێن پاکە)

**[سوڕەتی القصص:26]**

**کە ئەمە گومانی تیا نیە موسی (علیە سلام) پێغەمبەر بوە و بە دڵنیاییەوە پێغەمبەران باشترین و هەڵبژاردەی خوا بوونە**

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەی من سەرنجم دا باوکی بە کچەکەی وت تۆ چۆن دەزانی ؟

کچەکە بە باوکی وت: چونکە ئەم پیاوە ئەو بەردەی بەرزکردەوە کە بە دە پیاو بەرزناکرێتەوە ،،، **وە من کاتێک لا گەڵی بووم پێشی کەوتم، پێی وتم : تۆ لە دوامەوە بڕۆ.**

کەواتە لێرە ئەم پێغەمبەرە نازادار و ئەمینە وەک و ڕەوشتێکی بەرز و چاک بەو ئافرەتی وت تۆ لە دوامەوە بڕۆ ، ئەمە لە کاتێکدا بوو ئەو کچە خۆی داپۆشیبوو بە جلێکی شەرعی و بەشەرم و حەیا بوە و حجابەکەی دابوو بە ڕووی خۆیدا ،، لەگەڵ ئەمەش پێی وت تۆ لە دواوە برۆ

بۆیە ئێمە لێرە ڕەوشتێکی بەرز فێر ئەبین خوشکان و بۆ برایانش کە خوشکان ئەبێت لە دواوەی پیاوان بڕۆن هەموو کات خۆ ئەگەر ناچار بیت و نەتوانی ئەوا لە ناوەڕاستی ڕێگادا مەرۆ و بە لاپاڵی ڕێگا و دیوارەکان برۆ ڕێوە ئا ئەمە ئافرەتێک داپۆشراو بوە و ئەوەنە بەشەرم و حەیا بوە کە خوای گەورە لە قورئان باسی کردوە چۆن بە شەرمەوە ڕێگای ئەکرد،، وە ئەویش پێغەمبەر بوە و چاکترین کەسەکان بوون ئینجا بەم شێوەیە بووە..

دەی ئەمە زۆر زەروورترە بۆ خوشک و برایانی ئەم ڕۆژگارە
کە ئافرەتان زۆربەی زۆری نیمچە ڕووت و سفورن یاخود
جلێکی بەناو شەرعیان لەبەرە کە تەنها یەک مەرجی جلی
شەرعی تیا نیە ، دەی خوشکی ئەزیزم خۆت ئێستا هەڵبژێرە
ئەتەوێ خاوەنی ئەو وەسف و سەنایە بیت کە لە قورئان هاتوە یان
لەڕیزی ئەو کەسانەبیت کە خوای گەورە لەعنەتی لێکردوون...!!

**{مەرجەکانی حیجابی شەرعی}**

١.دەبێ هەموو لەشت داپۆشێ .

٢.ئەبێت بۆن خۆش نەبێت.

٣.ئەبێت تەسک نەبێت.

٤.ئەبێت ڕازاوە نەبێت .

٥.دەبێت تەنک نەبێت کەئەوەی لەژێریدایە دەری بخات

٦.ئەبێت لەجلی پیاوان نەچێت.

٧.ئەبێ لەجلی بێباوەڕان نەچێت.

٨.وەحیجاب و قژت وەک کۆبانەی حوشتر ئەوە حیجاب نییە
حیجاب و مکیاج ئەوە حیجاب نییە حیجاب و پێڵاوی پاژنە
بەرزوو نینۆکی درێژوو بۆیە حیجاب نییە.

**ئەزیزانم سەیر بکەن بزانن تاچەند مەرجەکانی حیجاب(نیقاب)ی
شەرعی لەو جلانەدا هەیە کە تۆ لەبەری دەکەیت..!!**

**{{الحمدالله رب العالمين }}**